# الأربعين النووية

# بەکوردی

دانراوی

**ئیمام نەوەوی**

وەرگێڕانی

**إسماعیل طه إبراهیم**



ناوی دانـــــــــــەر: ئیمامی نەوەوی

نـــــــاوی کتێـــــــب : الأربعين النووية بەکوردی

نـــــــاوی وەرگێـــــــر: إسماعيل طه إبراهيم

چـــــاپ و بڵاوکردنــــــەوەی: نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن/هەولێر

نەخشەســـــــــــازی: شنۆ حمدامين

خـــــــــــــــــەت: نـــەوزاد کۆیـــی

بـــــــــــــــــەرگ: ئەمیـن مخـلـص

نـــــۆرە و ســـــاڵی چـــاپ: یەکەم ١٤٣٢ك - ٢٠١١ز

تـــــــــــــــیراژ: ١٠٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی سپاردن (١٥٧٤) ساڵی ٢٠١١ی پێدراوە



# پێشەكی

كتـێبی ئەربەعینیـەی نـەوەوی یەكێكـە لـە كتێبـەكانی فـەرمودە، سـەرەتای ئـەم كتێبــە دەگەرێتــەوە بـۆ زانــای بەناوبانگی كورد إبن صلاحی شارەزوری، كە لە یـەكێك لـە زنجیرەكـانی دەرس گوتنــەوە بیسـت وشــە ش فــەرمودەی كـۆكردەوە، كــە زیــاتر پەیوەسـت بــون بــە شــەریعەتی ئیسلامەوە، دواتـر زانای بەناوبانگ ئیمامی نـەوەوی شازدە فـەرمودەی تـری بۆزیـادكرد، بـو بـە چـل فـەرمودە ناوینـا ئەربەعینەی نەوەوی، ئەم كتێبە بە قـەبارە بچوكە، بـەلاّم زانسـتێكی زۆری لـە خۆگرتـوە، هەربۆیـەش تـا ئێسـتا بـۆ جەنـدین زمـان وەرگێـڕدراوە. هـەروەها زانایـان جەنـدین شـەرحی كـورت و درێـژیان لەسـەر كـردووە، ناودارترینیـان (جامع العلوم والحكم) دانـراوی ئـیبن رەجـەبی حەنبەلیـە،

بۆیە بەپێویستمان زانی ئەم زانستە ناوازەیە وەربگێڕینە سەر زمانی کوردی، بە سود وەرگرتن لە کتێبی(شرح الأربعين النووية) دانراوی شێخ صاڵح عبدالعزيز بن محمد ئال الشێخ

لەخوای گەورە داواکارین ئەم کارەمان بکات بە توێشوی قیامەت.

وەرگێڕ

٢٨جمادی یەکەم ١٤٣٢

٢٠١١/٥/١

## فەرمودەی یەکەم

## کردەوەکان بە پێی نیەتە

عَنْ أَمِيرِ الْمُؤْمِنِينَ أَبِي حَفْصٍ عُمَرَ بْـنِ الْخَطَّـابِ ﷺ قَـالَ: سَمِعْت رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: إنَّمَا الْأَعْمَـالُ بِالنِّيَـاتِ، وَإِنَّمَـا لِكُلِ امْرِئٍ مَا نَوَى، فَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ إلَـى اللَّـهِ وَرَسُـولِهِ فَهِجْرَتُـهُ إلَـى اللَّـهِ وَرَسُـولِهِ، وَمَـنْ كَانَـتْ هِجْرَتُـهُ لِـدُنْيَا يُصِيبُهَا ،أَو امْرَأَةٍ يَنْكِحُهَا فَهِجْرَتُه إلَى مَا هَاجَرَ إلَيهِ.

أخرجه البخاري (١)، ومسلم(١٩٠٧/١٥٥)

واتــە: عومــەری کــوڕی خــەتاب دەڵێــت: گــوێم لــە پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـو دەیفـەرمو: هـەمو کردەوەیـەك بـە

نیەتــە، هەركەســێك نیــەتی چــی هــەبێت ئــەوەی بــۆ دەنوسرێت، ئەگەر كەسێك كۆچكردنەكەی لە پێنـاو خـوا بێــت بــۆ لای پێغەمبەرەكــەی، ئــەوا بــەم نیەتــە بــۆی دەنوسرێت، هەروەها ئەگەر كەسێكیش كۆچكردنەكەی بۆ ئەوە بێت ماڵێكی دونیای دەست بكەوێت، یا بۆ ئافرەتێـك، ئەوا ئەوەی بۆ دەنوسرێت.

## فەرمودەی دووەم

## هاتنی جوبرائیل بۆ ئەوەی موسلمانان فێری دینەکەیان بکات

عَنْ عُمَرَ ﷺ أَيْضًا قَالَ: بَيْنَمَا نَحْنُ جُلُوسٌ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ ذَاتَ يَوْمٍ، إِذْ طَلَعَ عَلَيْنَا رَجُلٌ شَدِيدُ بَيَاضِ الثِّيَابِ، شَدِيدُ سَوَادِ الشَّعْرِ، لَا يُرَى عَلَيْهِ أَثَرُ السَّفَرِ، وَلَا يَعْرِفُهُ مِنَّا أَحَدٌ. حَتَّى جَلَسَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ. فَأَسْنَدَ رُكْبَتَيْهِ إِلَى رُكْبَتَيْهِ، وَوَضَعَ كَفَّيْهِ عَلَى فَخِذَيْهِ، وَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ أَخْبِرْنِي عَنِ الإِسْلَامِ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الإِسْلَامُ أَنْ تَشْهَدَ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، وَتُقِيمَ الصَّلَاةَ، وَتُؤْتِيَ الزَّكَاةَ، وَتَصُومَ رَمَضَانَ، وَتَحُجَّ الْبَيْتَ إِنِ اسْتَطَعْتَ إِلَيْهِ سَبِيلًا. قَالَ: صَدَقْتَ . فَعَجِبْنَا لَهُ يَسْأَلُهُ وَيُصَدِّقُهُ! قَالَ: فَأَخْبِرْنِي عَنِ الإِيمَانِ. قَالَ: أَنْ تُؤْمِنَ بِاللَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ وَالْيَوْمِ

الآخِرِ، وَتُـؤْمِنَ بِالْقَـدَرِ خَيْـرِهِ وَشَـرِّهِ. قَـالَ: صَـدَقْتَ. قَـالَ: فَأَخْبِرْنِي عَنِ الإِحْسَانِ. قَالَ: أَنْ تَعْبُدَ اللَّهَ كَأَنَّك تَـرَاهُ، فَـإِنْ لَمْ تَكُنْ تَرَاهُ فَإِنَّهُ يَرَاك. قَالَ: فَأَخْبِرْنِي عَنِ السَّاعَةِ. قَالَ: مَا الْمَسْئُولُ عَنْهَا بِـأَعْلَمَ مِـنَ السَّـائِلِ. قَـالَ: فَـأَخْبِرْنِي عَـنْ أَمَارَاتِهَا؟ قَالَ: أَنْ تَلِدَ الأَمَةُ رَبَّتَهَا، وَأَنْ تَرَى الْحُفَاةَ الْعُـرَاةَ الْعَالَةَ رِعَاءَ الشَّاءِ يَتَطَاوَلُونَ فِي الْبُنْيَانِ. ثُمَّ انْطَلَقَ، فَلَبِثْنَا مَلِيًّا، ثُمَّ قَالَ: يَا عُمَـرُ أَتَـدْرِي مَـنْ السَّـائِلُ؟. قُلْـتُ: اللَّـهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: فَإِنَّهُ جِبْرِيلُ أَتَاكُمْ يُعَلِّمُكُمْ دِينَكُمْ .

رَوَاهُ مُسْلِمٌ(رقم:٨).

عومەری کوڕی خەتاب دەڵێت:

ڕۆژێکیـان لـە خزمـەت پێغەمبـەرﷺ دانیشـتبوین، لـە ناکاو پیاوێك دەرکەوت جلێکی سپی لەبەردابو، پرچی زۆر ڕەش بو، شوێنەواری سەفەری پێوە دیار نەبو، هـیچ کـەس لـە ئێمـە نەیدەناسـی، لەبـەردەم پێغەمبـەرﷺ دانیشـت،

ئـەژنۆی گەیانـدە ئـەژنۆی پێغەمبـەرﷺ، دەسـتی لەسـەر هەردوو ڕانی پێغەمبەرﷺ دانا.

گـوتی: ئـەی پێغەمبـەر! لـە بـارەی ئیسلام هـەواڵم پـێ بدە.

پێغەمبەرﷺ فەرموی: شایەتی بێنە خوای گەورە تـاكو تەنهایـە، نوێـژ بكـە، زەكـات بـدە، ڕۆژووی مـانگی ڕەمـەزان بگرە، حەج بكە ئەگەر توانات هەیە.

كابرا گوتی: ڕاست دەكەیت.

سـەرمان سـوڕما، پرسـیاری لێـدەكات و پاشـان دەڵێـت: ڕاست دەكەیت.

ئینجا گوتی: هەواڵم پێ بدە دەربارەی ئیحسان.

پێغەمبـەرﷺ فـەرموی: بـاوەڕت بـەخوا هـەبێت بـە فریشتەی خوا، بە كتێبەكانی پێغەمبەران، بە ڕۆژی دوایی بە قەزاو قەدەر چاكەو خراپەی.

كابرا گوتی: ڕاست دەكەیت، ئینجا گوتی: چاكە چیە.

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: خواپەرستی وەك ئەوەی ببیبینیت، ئەگەر تۆش ئەو نەبینیت، ئەو تۆ دەبینێت.

ئینجا گوتی: هەواڵم پێبدە لە بارەی ڕۆژی دوایی.

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: پرسیارکەر لە پرسیار لێکراو زاناتر نیە.

کابرا گوتی: ئەی نیشانەکانی چین؟

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: دایك ببێتە خوورام و خزمەتکاری کچەکەی خۆی، خەڵکانی پێخواس و ڕوت و شوانەوێرە دەبنە خاوەن کۆشك و تەلار.

پاشان ڕۆیشت، ئێمەش سێ ڕۆژ ماینەوە ئینجا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەی عومەر: دەزانی ئەم پرسیارەکەر کێ بو؟

گوتم: خواو پێغەمبەر باشتر دەزانن.

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەوە جبرائیل بو هاتبو ئاینەکەتان فێر بکات.

## فەرمودەی سێیەم

## ئیسلام لە سەر پێنج بنەما دامەزراوە

عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: سَمِعْت رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: بُنِيَ الإِسْلَامُ عَلَى خَمْسٍ: شَهَادَةِ أَنْ لَا إلَهَ إلَّا اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، وَإِقَامِ الصَّلَاةِ، وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ، وَحَجِّ الْبَيْتِ، وَصَوْمِ رَمَضَانَ. رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ(رقم:٨)، وَمُسْلِمٌ(رقم:١٦).

لە عەبدولاّی کوڕی عومەرەوە، کە دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بو، دەیفەرمو: ئیسلام لە سەر پێنج بنەما دامەزراوە، کە جگە لە خوا هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نیە، هەروەها محمد پێغەمبەری خوایە، ئەنجامدانی نوێژەکان، زەکات دان، حەجکردن، هەروەها ڕۆژووگرتنی مانگی ڕەمەزان.

## فەرمودەی چوارەم

**هەر یەكێك لەنێوە لە سكی دایكیدا چل ڕۆژ نوتفەیە**

عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: حَدَّثَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ -وَهُوَ الصَّادِقُ الْمَصْدُوقُ-: إِنَّ أَحَدَكُمْ يُجْمَعُ خَلْقُهُ فِي بَطْنِ أُمِّهِ أَرْبَعِينَ يَوْمًا نُطْفَةً، ثُمَّ يَكُونُ عَلَقَةً مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ يَكُونُ مُضْغَةً مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ يُرْسَلُ إِلَيْهِ الْمَلَكُ فَيَنْفُخُ فِيهِ الرُّوحَ، وَيُؤْمَرُ بِأَرْبَعِ كَلِمَاتٍ: بِكَتْبِ رِزْقِهِ، وَأَجَلِهِ، وَعَمَلِهِ، وَشَقِيٌّ أَمْ سَعِيدٌ، فَوَاللَّهِ الَّذِي لَا إِلَهَ غَيْرُهُ إِنَّ أَحَدَكُمْ لَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ الْجَنَّةِ حَتَّى مَا يَكُونُ بَيْنَهُ وَبَيْنَهَا إِلَّا ذِرَاعٌ فَيَسْبِقُ عَلَيْهِ الْكِتَابُ فَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ

فَيَدْخُلُهَا. وَإِنَّ أَحَدَكُمْ لَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ حَتَّى مَا يَكُونُ بَيْنَهُ وَبَيْنَهَا إِلَّا ذِرَاعٌ فَيَسْبِقُ عَلَيْهِ الْكِتَابُ فَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ الْجَنَّةِ فَيَدْخُلُهَا.

رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ (رقم:٣٢٠٨)، وَمُسْلِمٌ (رقم:٢٦٤٣).

واتە: عبدالله كوڕی مسعود گوتی:

پێغەمبەرﷺ، كە ڕاستگۆو باوەڕپێكراوە، فەرمووی:

دروستبونی هەریەك لە ئێوە لە زگی دایكی چل ڕۆژ (تۆ و ئاوە)، پاشان چل ڕۆژی تر دەبێتە پارچە خوێن، پاشان دەبێتە پارچە گۆشت، ئینجا خوای گەورە فەرمان بە فریشتە دەكات ڕوحی بكاتە بەر، هەروەها چوار شتی تری بۆ بنوسێت، ئەجەلی، كردەوەی چاكە یاخراپە كار، بەدبەختە یان بەختەوەرە.

ئینجا پێغەمبەرﷺ سوێندی خوارد بە خوا، كە جگە لەو كەستی تر نیە شایەنی پەرستن بێت، هەر یەك لە ئێوە بە شێوەی ئەهلی بەهەشت چاكە دەكات، تا یەك باڵی

دەمێنێت بگاتە بەهەشت، کەچی کردەوەکەی پێشی لێ دەگرێت، ئەمجارە بەکردەوەی ئەهلی دۆزەخ کردەوە دەکاتو دەچێتە دۆزەخەوە، هەروەها هەریەك لە ئێوە بە کردەوەی دانیشتوانی دۆزەخ کردەوە دەکات و هەتا یەك باڵی دەمێنێت، بەڵام دوایی بەکردەوەی ئەهلی بەهەشت کردەوە دەکات و دەچێتە بەهەشتەوە.

## فەرمموودەی پێنجەم

## هەرکەسێك لە دین شتێکی زیاد داهێنێت، لێی وەرناگرێت

عَنْ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ أُمِّ عَبْدِ اللّٰهِ عَائِشَةَ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهَا، قَالَتْ: قَالَ: رَسُولُ اللّٰهِﷺ **مَنْ أَحْدَثَ فِي أَمْرِنَا هَذَا مَا لَيْسَ مِنْهُ فَهُوَ رَدٌّ.**

رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ (رقم:٢٦٩٧)، وَمُسْلِمٌ (رقم:١٧١٨)

وَفِي رِوَايَةٍ لِمُسْلِمٍ: **مَنْ عَمِلَ عَمَلًا لَيْسَ عَلَيْهِ أَمْرُنَا فَهُوَ رَدٌّ.**

**عائیشە خوای لێ ڕازی بێ دەڵێت: پێغەمبەرﷺ فەمووی: هەرکەسێك لە دین شتێکی تازە زیاد بکات، لە ئێمە نیە، لە ریوایەتێکی تر هاتوە هەرکەسێك شتێك لەدین زیاد بکات، کە فەرمانی ئێمەی لەسەر نەبێت، ئەوا کارەکەی وەرناگیرێت.**

## فەرمودەی شەشەم

# حەڵاڵ و حەرام ڕونکراوەتەوە

عَنْ أَبِي عَبْدِ اللَّهِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: سَمِعْت رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: إنَّ الْحَلَالَ بَيِّنٌ، وَإِنَّ الْحَرَامَ بَيِّنٌ، وَبَيْنَهُمَا أُمُورٌ مُشْتَبِهَاتٌ لَا يَعْلَمُهُنَّ كَثِيرٌ مِنْ النَّاسِ، فَمَنْ اتَّقَى الشُّبُهَاتِ فَقْد اسْتَبْرَأَ لِدِينِهِ وَعِرْضِهِ، وَمَنْ وَقَعَ فِي الشُّبُهَاتِ وَقَعَ فِي الْحَرَامِ، كَالرَّاعِي يَرْعَى حَوْلَ الْحِمَى يُوشِكُ أَنْ يَرْتَعَ فِيهِ، أَلَا وَإِنَّ لِكُلِّ مَلِكٍ حِمًى، أَلَا وَإِنَّ حِمَى اللَّهِ مَحَارِمُهُ، أَلَا وَإِنَّ فِي الْجَسَدِ مُضْغَةً إذَا صَلَحَتْ صَلَحَ الْجَسَدُ كُلُّهُ، وَإِذَا فَسَدَتْ فَسَدَ الْجَسَدُ كُلُّهُ، أَلَا وَهِيَ الْقَلْبُ.

رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ (رقم:٥٢)، وَمُسْلِمٌ (رقم:١٥٩٩).

نعمانی کوڕی بەشیر دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بو، فەرموی:

حەڵاڵ ڕونكراوەتەوەو دیارە، حەرامیش ڕونكراوەتەوەو دیارە، لە نێوان حەڵاڵ و حەرام چەند شتێكی گوماناوی هەیە، زۆرێك لە خەڵك نایزانێت، هەركەسێك خۆی لەمانە بپارێزێت، ئەوە لە دین و عەرزیدا گومانی نەهێشتوەو پاكانەی بۆ كردوون هەركەسێكیش بكەتە گومانەوە ئەوە كەوتۆتە حەڕامەوە، هەروەك شوانێك ئاژەڵەكەی لە نزیك لەوەڕگایەك بلەوەڕێنێت، كە قەدەغە كرابێت، نزیكە ئاژەڵەكان بكەونە ناو لەوەڕگا قەدەغە كراوەو بیخۆن، ئەوجا بزانە كە هەمو پاشایەك سنوری خۆی هەیە، بزانن سنوری خوا حەڕامكراوەكانیەتی، ئاگاداربن، لەلاشەی مرۆڤ پارچە گۆشتێك هەیە، ئەگەر ئەم پارچە گۆشتە چاك بێت، ئەوا جەستەو هەمو لەش چاك دەبێت، ئەگەر ئەم پارچە گۆشتەش خراپ بێت هەمو جەستەو لاشە خراپ دەبێت، ئاگاداربن ئەوەش دڵە.

## فەرمودەی حەفتەم

# دین ئامۆژگاری و دڵسۆزییە

عَنْ أَبِي رُقَيَّةَ تَمِيمِ بْنِ أَوْسٍ الدَّارِيِّ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: الدِّينُ النَّصِيحَةُ. قُلْنَا: لِمَنْ؟ قَالَ لِلَّهِ، وَلِكِتَابِهِ، وَلِرَسُولِهِ، وَلِأَئِمَّةِ الْمُسْلِمِينَ وَعَامَّتِهِمْ.

رَوَاهُ مُسْلِمٌ (رقم:٥٥)

ئەبی روقیە کوڕی ئەوسی داری دەڵێت:

پێغەمبەرﷺ فەرموی: ئاین: ئامۆژگاری و دڵسۆزییە.

گوتمان: بەرامبەر بەکێ؟

فەرموی: بەرامبەر خواو کتێبەکەی و پێغەمبەرەکەیو پێشەوای موسڵمانان و موسڵمانان بەگشتی.

## فەرموودەی هەشتەم

**فەرمانم پێکراوە لە گەڵ خەڵکیدا بجەنگم، هەتا شایەتومان دەهێنن**

عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَشْهَدُوا أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، وَيُقِيمُوا الصَّلَاةَ، وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ، فَإِذَا فَعَلُوا ذَلِكَ عَصَمُوا مِنِّي دِمَاءَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ إِلَّا بِحَقِّ الْإِسْلَامِ، وَحِسَابُهُمْ عَلَى اللَّهِ تَعَالَى.

رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ (رقم:٢٥)، وَمُسْلِمٌ (رقم:٢٢).

ئیبن عومەر دەڵێت:

پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: فەرمانم پێکراوە لە گەڵ خەڵکیدا بجەنگم، هەتا شایەتومان دەهێنن، کە جگە لە

(الله) هيچ پەستراوێكی بەحەق نیە، محمدیش پێغەمبەری خوایە، نوێژبكەن، زەكات بدەن، ئەگەر ئەم دوانەیان كرد، ئەوا خوێن وماڵیان لە لایەن منەوە پارێزراوە، تەنها لە سەر مافی ئیسلام نەبێت، لێپرسینەوەشیان لە سەر خوای بەرزو مەزنە.

## فەرمودەی نۆیەم

## ئەو شتانەی لە ئێوەم قەدەغە کردووە، مەیکەن

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ صَخْرٍ ﵁ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: مَا نَهَيْتُكُمْ عَنْهُ فَاجْتَنِبُوهُ، وَمَا أَمَرْتُكُمْ بِهِ فَأْتُوا مِنْهُ مَا اسْتَطَعْتُمْ، فَإِنَّمَا أَهْلَكَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ كَثْرَةُ مَسَائِلِهِمْ وَاخْتِلَافُهُمْ عَلَى أَنْبِيَائِهِمْ.

رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ (رقم:٧٢٨٨)، وَمُسْلِمٌ (رقم:١٣٣٧).

عەبدورەحمانی کوڕی سەخر دەڵێ:

گوێم لێ بوو، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ئەو شتانەی لە نێوەم قەدەغەکردووە، ئێوە لێی دوور بکەونەوە،

هەرشتێکیش فەرمانم پێکردن بیکەن، ئەنجامی بدەن، هەرچەندێك لە تواناتاندا هەیە ئەنجامی بدەن، گەلانی پێش ئێوە بە هۆی پرسیارکردنی زۆرەوە دوبەرەکی و ناکۆکیان لە نێواندا دروست بو لەگەڵ پێغەمبەرەکانیاندا ئەمەش بوەتە هۆی لە ناوچونیان.

## فەرمودەی دەیەم

## خوا پاکەو پاکیش وەردەگرێت

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِنَّ اللَّهَ طَيِّبٌ لَا يَقْبَلُ إِلَّا طَيِّبًا، وَإِنَّ اللَّهَ أَمَرَ الْمُؤْمِنِينَ بِمَا أَمَرَ بِهِ الْمُرْسَلِينَ فَقَالَ تَعَالَى: يَا أَيُّهَا الرُّسُلُ كُلُوا مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَاعْمَلُوا صَالِحًا، وَقَالَ تَعَالَى: يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُلُوا مِنْ طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ ثُمَّ ذَكَرَ الرَّجُلَ يُطِيلُ السَّفَرَ أَشْعَثَ أَغْبَرَ يَمُدُّ يَدَيْهِ إِلَى السَّمَاءِ: يَا رَبِّ! يَا رَبِّ! وَمَطْعَمُهُ حَرَامٌ، وَمَشْرَبُهُ حَرَامٌ، وَمَلْبَسُهُ حَرَامٌ، وَغُذِّيَ بِالْحَرَامِ، فَأَنَّى يُسْتَجَابُ لَهُ؟

رَوَاهُ مُسْلِمٌ (رقم:١٠١٥).

**ئەبو هورەیرە دەڵێت: پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی:**

**خـودا پاکـەو پێگـەردە، تـەنها شـتی پـاك وەردەگرێـت،**

خـودا چ فـەرمانێکی بەسـەر موسڵمانانـدا دابێـت، ئەوەشـی بەسـەر پێغەمبـەرانی کـردوە، هـەروەکو فەرمویـەتی: ئـەی پێغەمبەران خواردنی حەڵاڵ بخۆن وکـردەوەی چاك بکـن، هەروەها دەفەرموێت: ئەی باوەڕداران ئەو خواردنە پـاك و حەڵاڵە بخۆن، کە پێمان بەخشیون، پاشـان باسـی پیـاوێکی کــرد، کــە درێــژەی بەســەفەرەکەی دەدات بــە پرچــێکی تۆزاویـەوە دەسـتی بـەرەوە ئاسمـان بەرزدەکاتـەوەو دەڵـێ پـەرومردگارا پـەروەردگارا، لـە کاتێـکدا خـواردنی حەڕامـە، خواردنەوەی حەڕامـە، جـل و بـەرگی حەڕامـە، بـە حـەرام گەورە بوە، جاچۆن خوای گەورە دوعای قبوڵ دەکات.

## فەرمودەی یازدەم

# واز لەم شتە بهێنە کە گومانت لێی هەیە

عَنْ أَبِي مُحَمَّدٍ الْحَسَنِ بْنِ عَلِيٍّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ سِبْطِ رَسُولِ اللَّهِﷺ وَرَيْحَانَتِهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: **حَفِظْتُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِﷺ دَعْ مَا يُرِيبُكَ إِلَى مَا لَا يُرِيبُكَ.**

رَوَاهُ التِّرْمِذِيُّ (رقم: ٢٥٢٠)، وَالنَّسَائِيّ(رقم: ٥٧١١)،وَقَالَ التِّرْمِذِيُّ: حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

**حەسەنی کوڕی عەلی کوڕی ئەبو تالیب، کە کچەزای پێغەمبەر و ڕەیحانەی پێغەمبەرﷺ بو، گوتی: ئەو لە پێغەمبەرەوەﷺ لە بەریکردووە، کە فەرمویەتی: واز لە شتێك بهێنە، کە گومانی تێدایەو لێی دڵنیانیت، ئەوە بکە کە گومان ناخاتە دڵتەوە ولێی دڵنیایت.**

## فەرمودەی دوازدەهەم

# خۆهەڵنەقورتاندن لە شتی خەڵك

**عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ مِنْ حُسْنِ إسْلَامِ الْمَرْءِ تَرْكُهُ مَا لَا يَعْنِيهِ.**

حَدِيثٌ حَسَنٌ، رَوَاهُ التِّرْمِذِيُّ (رقم: ٢٣١٨) ، ابن ماجه (رقم:٣٩٧٦).

**ئەبو هورەیرە دەڵێت:**

**پێغەمبەرﷺ فەرموی: یەكێك لە نیشانەكانی ڕەوشت جوانی موسڵمانیەتی ئەوەیە، كە خۆت لە شتێك هەڵنەقورتێنی، كەپەیوەندی بەتۆوە نیە.**

## فەرمودەی سێزدە

## چیت بۆ خۆت پێخۆشە، بۆ براکەشت بەهەمان شێوە

**عَنْ أَبِي حَمْزَةَ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ خَادِمِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ عَنْ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لَا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى يُحِبَّ لِأَخِيهِ مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ.**

رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ (رقم:١٣)، وَمُسْلِمٌ (رقم:٤٥).

**ئەنەسی کوڕی مالیك دەڵێت: باوەڕی هیچ کەسێك لە ئێوە دانامەزرێت، هەتا چی بۆخۆی پێخۆشە، ئەوەشی بۆ براموسڵمانەکەی پێخۆش نەبێت.**

## فەرمودەی چواردەهەم

## خوێنی موسڵمان بە یەکێ لە سێ شت حەڵاڵ دەبێت

عَنْ ابْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لَا يَحِلُّ دَمُ امْرِئٍ مُسْلِمٍ ( يشهد أن لا إله إلا الله، وأني رسول الله) إلَّا بِإِحْدَى ثَلَاثٍ: الثَّيِّبُ الزَّانِي، وَالنَّفْسُ بِالنَّفْسِ، وَالتَّارِكُ لِدِينِهِ الْمُفَارِقُ لِلْجَمَاعَةِ.

رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ (رقم:٦٨٧٨)، وَمُسْلِمٌ (رقم:١٦٧٦).

عبداللەی کوڕی مەسعود دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خواﷺ بو دەیفەرمو: خوێن ڕشتنی موسڵمان بە یەکێ لە سێ شت نەبێت حەڵاڵ نیە، پیاوێك زینا بکات، یا کەسێکی کوشتبێت، یا کەسێك واز لە ئاین بهێنێ و لەڕیزی موسڵمانان جیابێتەوە دژ بە ئیسلام بوەستێ.

## فەرمودەی پازدەهەم

**هەرکەسێ بڕوای بەخوا و ڕۆژی دوایی هەیە باقسەی چاك بکات، یا بێدەنگ بێت**

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَلْيَقُلْ خَيْرًا أَوْ لِيَصْمُتْ، وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَلْيُكْرِمْ جَارَهُ، وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَلْيُكْرِمْ ضَيْفَهُ.

رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ (رقم:٦٠١٨)، وَمُسْلِمٌ (رقم:٤٧).

ئەبو هورەیرە دەڵێت: پێغەمبەرﷺ فەرموی:

هەرکەسێك بڕوای بە خواو ڕۆژی دوایی هەیە، با قسەی چاك بکات، ئەگەر قسەی چاك ناکات با بێ دەنگ بێت، هەروەها هەرکەسێك بڕوای بە خواو ڕۆژی دوایی هەیە، با ڕێز لە دراوسێیەکانی بگرێت، هەرکەسێك بڕوای بە خواو ڕۆژی دوایی هەیە، باڕێز لە میوان بگرێت.

## فەرمودەی شازدەم

# تووڕەمەبە

**عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنْ رَجُلًا قَالَ لِلنَّبِيِّ ﷺ أَوْصِنِي. قَالَ: لَا تَغْضَبْ، فَرَدَّدَ مِرَارًا، قَالَ: لَا تَغْضَبْ.**

رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ (رقم:٦١١٦).

**ئەبو هورەیرە دەڵێت:**

**پیاوێك بە پێغەمبەریﷺ گوت: ئامۆژگاریم بکە.**

**پێغەمبەرﷺ فەرمووی: تووڕەمەبە.**

**پیاوەکە چەند جار دووبارەی کردەوە، پێغەمبەریشﷺ هەر فەرمووی: تووڕەمەبە.**

## فەرمودەی حەڤدەم

# خوا چاكەی لە سەر هەموشتێك نوسیوە

عَنْ أَبِي يَعْلَى شَدَّادِ بْـنِ أَوْسٍ ﷺ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِنَّ اللَّهَ كَتَبَ الْإِحْسَانَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ، فَإِذَا قَتَلْتُمْ فَأَحْسِنُوا الْقِتْلَةَ، وَإِذَا ذَبَحْتُمْ فَأَحْسِنُوا الذِّبْحَةَ، وَلْيُحِدَّ أَحَدُكُمْ شَفْرَتَهُ، وَلْيُرِحْ ذَبِيحَتَهُ.

رَوَاهُ مُسْلِمٌ (رقم:١٩٥٥).

ئەبو یەعلای كوڕی ئەوس دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: خوای گەورە فەرمانی پێكردووین چاكە لە هەموشتێك بكەین، ئەگەر یەكێكتان لە تۆڵەی خوێن كوشت بە جوانترین شێوە بیكوژن، هەروەها ئەگەر حەیوانێكتان سەربڕی، بە جوانترین شێوە سەری بڕن، چەقۆكەتان تیژ بكەن، با سەربڕاوەكەش بحەوێتەوەو پشویەكی پێ بدات.

## فەرمودەى هەژدەهەم

## لە هەر كوێبیە بویت لە خوا بترسە

عَنْ أَبِي ذَرٍّ جُنْدَبِ بْنِ جُنَادَةَ، وَأَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ **قَالَ: اتَّقِ اللَّهَ حَيْثُمَا كُنْتَ، وَأَتْبِعِ السَّيِّئَةَ الْحَسَنَةَ تَمْحُهَا، وَخَالِقِ النَّاسَ بِخُلُقٍ حَسَنٍ.**

رَوَاهُ التِّرْمِذِيُّ (رقم:١٩٨٧) وَقَالَ: حَدِيثٌ حَسَنٌ، وَفِي بَعْضِ النُّسَخِ: حَسَنٌ صَحِيحٌ.

**موعازى كوڕى جەبەل دەڵێت: پێغەمبەرﷺ فەرموى: لە هەركوێيەك بيت لە خوا بترسە، بەدواى خراپەدا، كردەوەى چاك بكە، ئەوا ئەو خراپەيە دەسڕێتەوە، لەگەڵ خەڵكيدا بە ڕەوشتى جوان هەڵسوكەوت بكە.**

## فەرمودەی نۆزدەهەم

## ڕۆڵە چەند وشەیەكت فێردەكەم

عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: كُنْت خَلْفَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يَوْمًا، فَقَالَ: يَا غُلَامُ! إنِّي أُعَلِّمُك كَلِمَاتٍ: احْفَظْ اللَّهَ يَحْفَظْك، احْفَظْ اللَّهَ تَجِدْهُ تُجَاهَك، إذَا سَأَلْت فَاسْأَلْ اللَّهَ، وَإِذَا اسْتَعَنْت فَاسْتَعِنْ بِاَللَّهِ، وَاعْلَمْ أَنَّ الْأُمَّةَ لَوْ اجْتَمَعَتْ عَلَى أَنْ يَنْفَعُوك بِشَيْءٍ لَمْ يَنْفَعُوك إلَّا بِشَيْءٍ قَدْ كَتَبَهُ اللَّهُ لَك، وَإِنْ اجْتَمَعُوا عَلَى أَنْ يَضُرُّوك بِشَيْءٍ لَمْ يَضُرُّوك إلَّا بِشَيْءٍ قَدْ كَتَبَهُ اللَّهُ عَلَيْك، رُفِعَتِ الْأَقْلَامُ، وَجَفَّتْ الصُّحُفُ .

رَوَاهُ التِّرْمِذِيُّ (رقم:٢٥١٦) وَقَالَ: حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

وَفِي رِوَايَةِ غَيْرِ التِّرْمِذِيِّ: احْفَظْ اللَّهَ تَجِدْهُ أمامك، تَعَرَّفْ إلَى اللَّهِ فِي الرَّخَاءِ يَعْرِفْك فِي الشِّدَّةِ، وَاعْلَمْ أَنَّ مَا أَخْطَأَك

لَمْ يَكُنْ لِيُصِيبَك، وَمَا أَصَابَك لَمْ يَكُنْ لِيُخْطِئَك، وَاعْلَمْ أَنَّ النَّصْرَ مَعَ الصَّبْرِ، وَأَنْ الْفَرَجَ مَعَ الْكَرْبِ، وَأَنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْرًا.

عبداللەی کوڕی عەبباس دەڵێت:

ڕۆژێك لە پشت پێغەمبەرەوە ﷺ لەسەر وڵاغێك بوم. فەرموی: ڕۆڵە چەند وشەیەكت فێردەكەم: پارێزگاری لە خوا بكە، خوای گەورە دەتپارێزێت، فەرمانەكانی خوا بپارێزە، دەبینیت خوا فریات دەكەوێ ئەگەر پاڕایتەوە تەنها لەو بپاڕێوە، ئەگەر داواشت كرد تەنها لەو داوا بكە، بشزانە ئەگەر هەرچی خەڵكی دونیا هەیە كۆببنەوەو بیانەوێت، كە سودێكت پێ بگەیەنن، بەهیچ جۆرێك سودت پێ ناگەیەنن، تەنها ئەوە نەبێت، كە خوا بۆی نوسیویت، هەروەها ئەگەر كۆببنەوەبۆ ئەوەی زیانت پێبگەینن ناتوانن زیانت پێ بگەینن تەنها ئەوە نەبێت خوای گەورە لەسەرتی نوسیوە، قەڵەمەكان هەڵگیران و

نوسراوەكان وشك بونەتەوە (قەزاو قەدەری خوا براوەتەوە).

لە ڕیوایەتێكی تر هاتوە:

فەرمانەكانی خوا بپارێزە، خوای گەورەش بەرەو لاتدێت، لە كاتی خۆشیدا خوای گەورە بناسە، ئەوا خوای گەورەش لە كاتی ناخۆشیدا بەهانات دێت، بزانە، خراپە، یان چاكە، كە توشی تۆ نابێت، لە یەكەمەوە بڕاوەتەوە، كە توشی تۆ نەبێ، ئەوەی توشیشت دەبێ لە چاكە، یان خراپە، لە یەكەمەوە بڕاوەتەوە، كە توشت دەبێ و هی كەسێكی دیكە نیە بزانە، كەسەركەوتن لە گەڵ ئارامگرتندایە، ڕزگاربون لەگەڵ ناخۆشی و نارەحەتیدایە، لەگەڵ هەمو ناخۆشیەك و ئازارێكدا، خۆشیەكی بەدواوە دێت.

## فەرمودەی بیستەم

# گەر شەرمت نەكرد چی دەكەی بیكە

عَنْ ابْنِ مَسْعُودٍ عُقْبَةَ بْنِ عَمْرٍو الْأَنْصَارِيِّ الْبَدْرِيِّ ﷺ قَالَ: **قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِنَّ مِمَّا أَدْرَكَ النَّاسُ مِنْ كَلَامِ النُّبُوَّةِ الْأُولَى: إِذَا لَمْ تَسْتَحِ فَاصْنَعْ مَا شِئْتَ.**

رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ (رقم:٣٤٨٣).

**عوقبەی كوڕی عەمری ئەنساری بەدری دەڵێت:**

**پێغەمبەری ﷺ خوا فەرموی: ئەوەی، كە خەڵك لە پێغەمبەرانی پێشو گواستبێتیانەوە، ئەوەیە ئەگەر شەرم ناكەیت، چی دەكەیت بیكە.**

## فەرمودەی بیست ویەك

**بلێ: باوەڕی تەواوم بە خوا هەیە، ئینجا لەسەر ئەم باوەڕە بەردەوام بە**

عَنْ أَبِي عَمْرٍو وَقِيلَ: أَبِي عَمْرَةَ سُفْيَانَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قُلْت: يَا رَسُولَ اللَّهِ! قُلْ لِي فِي الْإِسْلَامِ قَوْلًا لَا أَسْأَلُ عَنْهُ أَحَدًا غَيْرَك، قَالَ: قُلْ: آمَنْت بِاَللَّهِ ثُمَّ اسْتَقِمْ.

رَوَاهُ مُسْلِمٌ (رقم:٣٨).

سوفیانی كوڕی عبداللە دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خواﷺ دەربارەی ئاینی ئیسلام شتێكم پێ بڵێ، پێویستم بە كەسی تر نەبێت، فەرموی: بڵێ: باوەڕی تەواوم بە خوا هەیە، ئینجا لەسەر ئەم باوەڕە بەردەوام بە.

## فەرمودەی بیست و دوو

## ئەگەر نوێژەكانم بكەم و ڕۆژی ڕەمەزانم گرت

عَنْ أَبِي عَبْدِ اللَّهِ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ الأَنْصَارِيِّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: **أَنَّ رَجُلًا سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: أَرَأَيْت إذَا صَلَّيْت الْمَكْتُوبَاتِ، وَصُمْت رَمَضَانَ، وَأَحْلَلْت الْحَلَالَ، وَحَرَّمْت الْحَرَامَ، وَلَمْ أَزِدْ عَلَى ذَلِكَ شَيْئًا، أَأَدْخُلُ الْجَنَّةَ؟**
قَالَ: نَعَمْ. رَوَاهُ مُسْلِمٌ (رقم:١٥).

**جابری كوڕی عبداللەی ئەنصاری دەڵێت: پیاوێك پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ كرد گوتی: هەركاتێ نوێژە فەرزەكانم كرد، ڕۆژووی ڕەمەزانم گرت، حەڵاڵم بە حەڵاڵ زانی، حەڕامم بە حەڕام زانی و لێ دوركەوتمەوە، لەمە زیاترم نەكرد، ئایا دەچمە بەهەشت؟ پێغەمبەر ﷺ فەرموی: بەڵێ، بەبێ سزادان دەچیتە بەهەشت.**

## فەرمودەی بیست وسێ

## پاك وخاوێنی نیوەی ئیمانە

**عَنْ أَبِي مَالِكٍ الْحَارِثِ بْنِ عَاصِمٍ الْأَشْعَرِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الطُّهُورُ شَطْرُ الْإِيمَانِ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ تَمْلَأُ الْمِيزَانَ، وَسُبْحَانَ اللَّهِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ تَمْلَآنِ -أَوْ: تَمْلَأُ- مَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ، وَالصَّلَاةُ نُورٌ، وَالصَّدَقَةُ بُرْهَانٌ، وَالصَّبْرُ ضِيَاءٌ، وَالْقُرْآنُ حُجَّةٌ لَك أَوْ عَلَيْك، كُلُّ النَّاسِ يَغْدُو، فَبَائِعٌ نَفْسَهُ فَمُعْتِقُهَا أَوْ مُوبِقُهَا.**

رَوَاهُ مُسْلِمٌ (رقم:٢٢٣).

**مالیکی کوڕی حارسی کوڕی عاصمی ئەشعەری دەڵێت: پێغەمبەرﷺ فەرموی: پاك ڕاگرتنی مرۆڤ لە هەمو شتێك نیوەی ئیمانە، (الحمدلله) خێری ئەوەندە زۆرە تەرازووی ڕۆژی قیامەت پڕدەكات، گوتنی: (سبحان الله**

والحمدلله) بەیەکەوە خێری ئەوەندە زۆرە، نێوانی ئاسمان و زەوی پڕدەکات، نوێژکردنی بەرێکو پێکی ڕووناکیە بۆناو گۆڕ، خێرکردن بەلگەیە لەسەر خاوەنەکەی لە دونیاوقیامەتدا، ئارام گرتن لەسەر خراپە نەکردن خواپەرستی و ڕۆشناییە، قورئانی پیرۆز شایەتە بۆتۆ لە ڕۆژی قیامەتدا ئەگەر عەمەلت پێ کردبێت، یان شایەتە لەسەرت ئەگەر عەمەلت پێ نەکردبێت، هەمو کەسێك، کە ڕۆژ هات بە کارێك خەریك دەبێ، هەندێك کەس خۆی دەفرۆشێت بە خوای گەورە، ئەمە ئازاد دەکات لە ئاگری دۆزەخ، هەندێکیشیان هەیە خۆی بەشەیتان دەفرۆشێت و لە ڕۆژی دوایی ماڵی وێران دەبێ.

## فەمودەی بیست و چوار

## بەندەكانم: من ستەمم لە سەر خۆم حەرام كردووە

عَنْ أَبِي ذَرٍّ الْغِفَارِيِّ ﷺ عَنْ النَّبِيِّ ﷺ فِيمَا يَرْوِيهِ عَنْ رَبِّهِ تَبَارَكَ وَتَعَالَى، أَنَّهُ قَالَ: يَا عِبَادِي: إِنِّي حَرَّمْتُ الظُّلْمَ عَلَى نَفْسِي، وَجَعَلْتُه بَيْنَكُمْ مُحَرَّمًا، فَلَا تَظَالَمُوا. يَا عِبَادِي! كُلُّكُمْ ضَالٌّ إلَّا مَنْ هَدَيْته، فَاسْتَهْدُونِي أَهْدِكُمْ. يَا عِبَادِي! كُلُّكُمْ جَائِعٌ إلَّا مَنْ أَطْعَمْته، فَاسْتَطْعِمُونِي أُطْعِمْكُمْ. يَا عِبَادِي! كُلُّكُمْ عَارٍ إلَّا مَنْ كَسَوْته، فَاسْتَكْسُونِي أَكْسُكُمْ. يَا عِبَادِي! إنَّكُمْ تُخْطِئُونَ بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ، وَأَنَا أَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا، فَاسْتَغْفِرُونِي أَغْفِرْ لَكُمْ. يَا عِبَادِي! إنَّكُمْ لَنْ تَبْلُغُوا ضُرِّي فَتَضُرُّونِي، وَلَنْ تَبْلُغُوا نَفْعِي فَتَنْفَعُونِي. يَا عِبَادِي! لَوْ أَنَّ أَوَّلَكُمْ وَآخِرَكُمْ وَإِنْسَكُمْ

وَجِنَّكُمْ كَانُوا عَلَى أَتْقَى قَلْبِ رَجُلٍ وَاحِدٍ مِنْكُمْ، مَا زَادَ ذَلِكَ فِي مُلْكِي شَيْئًا. يَا عِبَادِي! لَوْ أَنَّ أَوَّلَكُمْ وَآخِرَكُمْ وَإِنْسَكُمْ وَجِنَّكُمْ كَانُوا عَلَى أَفْجَرِ قَلْبِ رَجُلٍ وَاحِدٍ مِنْكُمْ، مَا نَقَصَ ذَلِكَ مِنْ مُلْكِي شَيْئًا. يَا عِبَادِي! لَوْ أَنَّ أَوَّلَكُمْ وَآخِرَكُمْ وَإِنْسَكُمْ وَجِنَّكُمْ قَامُوا فِي صَعِيدٍ وَاحِدٍ، فَسَأَلُونِي، فَأَعْطَيْت كُلَّ وَاحِدٍ مَسْأَلَته، مَا نَقَصَ ذَلِكَ مِمَّا عِنْدِي إلَّا كَمَا يَنْقُصُ الْمِخْيَطُ إذَا أُدْخِلَ الْبَحْرَ. يَا عِبَادِي! إنَّمَا هِيَ أَعْمَالُكُمْ أُحْصِيهَا لَكُمْ، ثُمَّ أُوَفِّيكُمْ إيَّاهَا، فَمَنْ وَجَدَ خَيْرًا فَلْيَحْمَدِ اللَّهَ، وَمَنْ وَجَدَ غَيْرَ ذَلِكَ فَلَا يَلُومَن إلَّا نَفْسَهُ.

رَوَاهُ مُسْلِمٌ (رقم:٢٥٧٧)

ئەبی زەری غەفاری فەرمودەیەکی قودسی دەگێڕێتەوە دەڵێت: پێغەمبەرﷺ فەرموی:

خوای گەورە دەفەرموێت: بەندەکانم! من ستەمم لە خۆم حەرام کردوە، کەواتە ئێوەش ستەم لەیەکتر مەکەن، بەندەکانم! ئێوە گومڕابون من ڕێم نیشان دان، داوای ڕێنیشاندانم لێ بکەن.

بەنـدەكانم هـەموتان برسـين بـون مـن ڕۆزيـم پێـدان، داوای ڕۆزيم لێ بكەن.

بەنـدەكانم! ئێـوە بـێ جـل وبـەرگ بـون، مـن پۆشـتەم كردن، دوای جل و بەرگم لێ بكەن.

بەنـدەكانم! ئێـوە بەشـەوڕۆژ تـاوان دەكـەن داوای لـێ خۆشبونم لێ بكەن لێتان خۆش دەبم.

بەندەكانم! ئێوە ناتوانن زيانم پـێ بگەيـەنن، هـەروەها ناشتوانن سودم پێ بگەيەنن.

بەندەكانم! ئەگـەر لەيەكـەمين كەسـتان، تـا دواكەسـتان بە مـرۆ و جنۆكـەوە لـە سـەر دڵـی باشـترين پياوچاك بـن، هيچ لە دەسەڵات و گەورەيی من زياد ناكات.

بەندەكانم! ئەگەر لـە يەكـەمين كەسـتان تـا دواكەسـتان بـە مـرۆ و جنۆكەوەلـە ئێـوە لەسـەر دڵـی خـراپترين پيـاو بێت، ئەوا هيچ زيان بە من ناگات لە گـەورەی و دەسـەڵاتی من كەم نابێتەوە.

بەندەكانم! ئەگەر لەيەكەمين كەستان، تا دواكەستان بە مرۆ و جنۆكەوە لە دەشتێكدا كۆببنەوە داوای شتێكم لێ بكەن هەريەك داواكەی پێ بدەم، ئەوە هيچ لە مولكی من كەم نابێتەوە، تەنها وەك ئەوە دەرزی لە دەريا هەڵێنجی.

بەندەكانم! ئەو كردەوە چاكانەو خراپانە، كردەوەی خۆتانە، فريشتەكانم كردەوەكانتان دەژمێرێت، لە ڕۆژی دوايی دەيدەمەوە دەستتان، پاداشت و سزاش هەر بە گوێرەی كردەوەكانتانە، هەركەسێ خراپەی كردوە، با سەرزەنشتی خۆی بكات و سەرزەنشتی كەس نەكات.

## فەرمودەی بیست وپێنج

## دەوڵەمەندان پاشتی گەورەیان بەدەست هێناوە

عَنْ أَبِـي ذَرٍّ ﷺ أَيْضًـا، أَنَّ نَاسًـا مِـنْ أَصْحَابِ رَسُـولِ اللَّهِ ﷺ قَالُوا لِلنَّبِيِّ ﷺ يَا رَسُولَ اللَّـهِ ذَهَـبَ أَهْـلُ الـدُّثُورِ بِـالأُجُورِ، يُصَـلُّونَ كَمَـا نُصَـلِّي، وَيَصُـومُونَ كَمَـا نَصُـومُ، وَيَتَصَدَّقُونَ بِفُضُولِ أَمْوَالِهِمْ. قَالَ: أَوَلَيْسَ قَدْ جَعَلَ اللَّهُ لَكُمْ مَا تَصَّدَّقُونَ؟ إِنَّ بِكُلِّ تَسْبِيحَةٍ صَدَقَةً، وَكُلِّ تَكْبِيرَةٍ صَـدَقَةً، وَكُلِّ تَحْمِيدَةٍ صَدَقَةً، وَكُلِّ تَهْلِيلَـةٍ صَـدَقَةً، وَأَمْـرٌ بِمَعْـرُوفٍ صَدَقَةٌ، وَنَهْيٌ عَنْ مُنْكَرٍ صَدَقَةٌ، وَفِي بُضْعِ أَحَـدِكُمْ صَـدَقَةٌ. قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَيَأْتِي أَحَدُنَا شَهْوَتَهُ وَيَكُـونُ لَـهُ فِيهَـا

**أجْرٌ؟ قَالَ: أرَأَيْتُمْ لَوْ وَضَعَهَا فِي حَرَامٍ أكَانَ عَلَيْهِ وِزْرٌ؟ فَكَذَلِكَ إِذَا وَضَعَهَا فِي الْحَلَالِ، كَانَ لَهُ أجْرٌ.**

رَوَاهُ مُسْلِمٌ (رقم:١٠٠٦).

**ئەم فەرمودەیەش لە ئەبو زەری غەفاریەوە گێڕدراوەتەوە، کە چەند کەسێك بە پێغەمبەریانﷺ گوت:**

**ئەی پێغەمبەری خواﷺ! دەوڵەمەندەکان پاداشتی گەورەیان بەدەست هێناوە لە دونیاو دوارۆژدا، هەروەك ئێمە نوێژ دەکەن و بەڕۆژوو دەبن، جگە لە نوێژو ڕۆژوو سامان وماڵیشیان هەیە، لە ڕێگای خوای گەورەدا دەیکەنە خێر، ئێمە ماڵمان نیە بیکەین بەخێر.**

**پێغەمبەرﷺ فەرموی: خوا ڕێگای زۆری بۆ ئێوە داناوە خێری پێ بکەن، هەرجارێك بڵێن: (سبحان الله) خێرێکتان بۆ دەنوسێت، هەرجارێك بڵێن: (الله أكبر) خێرێکتان بۆ دەنوسێت، هەروەها هەرجارێك بڵێن: (لاإلە إلا الله)**

خێرێکی هەیە، هەرفەرمان کردنێك بەچاکە خێرە، هەر نەهی کردنێك لە خراپە خێرێکی هەیە، جوتبون لەگەڵ خێزانی خۆت بە خێر بۆت دەنوسرێت.

هاوەڵەکان گوتیان: ئەی پێغەمبەری خواﷺ! ئەگەر ئێمە بۆ تێرکردنی ئارەزوی خۆمان لەگەڵ خێزانی خۆمان جوت بین، خێرمان بۆ دەنوسرێت؟!

پێغەمبەرﷺ فەرموی: ئەگەر کەسێك ئارەزووی خۆی لە حەرام تێر بکات، ئایە بەگوناح بۆی نانوسرێت؟ کەواتە هەرکەسێك لە حەڵاڵ ئارەزووی خۆی تێر بکات، پاداشتی لەسەر دەدرێتەوە.

## فەرمودەی بیست وشەش

## هەر جومگەیەكی خەڵك خێرێكی لە سەرە

**عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ كُلُّ سُلَامَى مِنَ النَّاسِ عَلَيْهِ صَدَقَةٌ، كُلَّ يَوْمٍ تَطْلُعُ فِيهِ الشَّمْسُ تَعْدِلُ بَيْنَ الِاثْنَيْنِ صَدَقَةٌ، وَتُعِينُ الرَّجُلَ فِي دَابَّتِهِ فَتَحْمِلُهُ عَلَيْهَا أَوْ تَرْفَعُ لَهُ عَلَيْهَا مَتَاعَهُ صَدَقَةٌ، وَالْكَلِمَةُ الطَّيِّبَةُ صَدَقَةٌ، وَبِكُلِّ خُطْوَةٍ تَمْشِيهَا إِلَى الصَّلَاةِ صَدَقَةٌ، وَتُمِيطُ الْأَذَى عَنِ الطَّرِيقِ صَدَقَةٌ.**

رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ (رقم:٢٩٨٩)، وَمُسْلِمٌ(رقم:١٠٠٩).

**ئەبو هورەیرە دەڵێت:**

**پێغەمبەرﷺ فەرموی: هەمو ڕۆژێك جومگەكانی مرۆڤ خێرێكی لە سەرە، هەمو ڕۆژێك، كە ڕۆژی تێدا هەڵدێت،**

ئاشتکردنەوەی دووکەس، کە ناکۆکییان لەنێواندا هەیە، یارمەتی مرۆڤ بدەیت بۆ سواربونی ولاّغەکەی بە خێر بۆت دەنوسرێت، یان بارەکەی لەگەڵ باربکەیت، ئەمەش بەخێر بۆت دەنوسرێت، لابردنی ئەو شتانەی لە سەر ڕێگا زیان بە خەڵك دەگەیەنن، بە خێر بۆت دەنوسرێت.

## فەرمودەی بیست و حەفت

# چاکە ڕەوشت جوانیە

**عَنْ النَّوَّاسِ بْنِ سَمْعَانَ ﷺ عَنْ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: الْبِرُّ حُسْنُ الْخُلُقِ، وَالْإِثْمُ مَا حَاكَ فِي صَدْرِك، وَكَرِهْت أَنْ يَطَّلِعَ عَلَيْهِ النَّاسُ.**

رَوَاهُ مُسْلِمٌ (رقم:٢٥٥٣).

**وَعَنْ وَابِصَةَ بْنِ مَعْبَدٍ ﷺ قَالَ: أَتَيْت رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: جِئْتَ تَسْأَلُ عَنِ الْبِرِّ؟ قُلْت: نَعَمْ. فقَالَ: استفت قلبك، الْبِرُّ مَا اطْمَأَنَّتْ إلَيْهِ النَّفْسُ، وَاطْمَأَنَّ إلَيْهِ الْقَلْبُ، وَالْإِثْمُ مَا حَاكَ فِي النَّفْسِ وَتَرَدَّدَ فِي الصَّدْرِ، وَإِنْ أَفْتَاك النَّاسُ وَأَفْتَوْك.**

حَدِيثٌ حَسَنٌ، رَوَيْنَاهُ فِي مُسْنَدَي الإِمَامَيْنِ أَحْمَدَ بْنِ حَنْبَلٍ (رقم:٤/٢٢٧)، وَالدَّارِمِيِّ (٢/٢٤٦) بِإِسْنَادٍ حَسَنٍ.

أـ نەواسی کوڕی سمعان دەڵێت: پێغەمبەرﷺ فەرموی: چاکە ڕەوشت جوانیە، خراپە ئەوەیە، کە دڵت پێی توندەو حەزناکەیت خەڵك پێی بزانێت.

ب ـــ وابیصەی کوڕی دەڵێت: گوتویەتی: چومە خزمەت پێغەمبەری خواﷺ، پێغەمبەرﷺ فەرموی: هاتویی پرسیار دەربارەی چاکە بکەیت؟ گوتم: بەڵی، پێغەمبەرﷺ فەرموی: لە دڵت بپرسە، چاکە ئەوەیە دڵ و دەرونت پێی ئارام بێت، خراپەش ئەوەیە کار لەدڵ بکات و دڵت پێی ناخۆش بێ و لێی دوو دڵ بیت. هەر بۆیە بەپێی دڵت واز لەم خراپە بهێنە، هەرچەندە زانایان فتوات بۆ بدەن، هەروەها دیسان فتوات بۆ بدەن.

## فەرمودەی بیست وهەشت

## ئامۆژگاریتان دەكەم لەخوا بترسن

عَنْ أَبِي نَجِيحٍ الْعِرْبَاضِ بْنِ سَارِيَةَ ﷺ قَالَ: وَعَظَنَا رَسُولُ اللَّه ﷺ مَوْعِظَةً وَجِلَتْ مِنْهَا الْقُلُوبُ، وَذَرَفَتْ مِنْهَا الْعُيُونُ، فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّه! كَأَنَّهَا مَوْعِظَةُ مُوَدِّعٍ فَأَوْصِنَا، قَالَ: أُوصِيكُمْ بِتَقْوَى اللَّه، وَالسَّمْعِ وَالطَّاعَةِ وَإِنْ تَأَمَّرَ عَلَيْكُمْ عَبْدٌ، فَإِنَّهُ مَنْ يَعِشْ مِنْكُمْ فَسَيَرَى اخْتِلَافًا كَثِيرًا، فَعَلَيْكُمْ بِسُنَّتِي وَسُنَّةِ الْخُلَفَاءِ الرَّاشِدِينَ الْمَهْدِيِّينَ، عَضُّوا عَلَيْهَا بِالنَّوَاجِذِ، وَإِيَّاكُمْ وَمُحْدَثَاتِ الأُمُورِ، فَإِنَّ كُلَّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ.

رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ (رقم:٤٦٠٧)، وَالتِّرْمِذِيُّ (رقم:٢٦٦) وَقَالَ: حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

ئەبو نەجیحی عیرباز كوڕی ساریە دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ وتارێكی بۆ داین، وتارەكەی ئەوەندە توند بو دڵی پێ

ئەهاتە لەرزین، چاوانی پێ ئەهاتە گریان، ئێمەش گوتمان: ئەی پێغەمبەری خواﷺ لەم ئامۆژگاریەت وا دەردەکەوێت ئامۆژگاری ماڵئاوایی بێت، ئامۆژگاریمان بکە. فەرموی:

لە خوا بترسن، هەروەها گوێڕایەڵی فەرمانەکانی گەورەکانتان بن، ئەگەر گەورەکەتان بەندەیەك بێت، ئەگەر کەسێك لە ئێوە تەمەنی درێژ بێت، ناکۆکی زۆر دەبینێت، پابەندبن بە سوننەتی من و ڕێوشوێنی خولەفای ڕاشیدین و بەریمەدەن، بەددان بیگرن، خۆتان لە داهێنراوەکان بە دوور بگرن، چونکە هەموو بیدعەیەك گومڕاییە.

## فەرمودەی بیست ونۆ

## خوا بپەرستەو هاوەڵی بۆ پەیدا مەکە

عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ ﷺ قَالَ: قُلْت يَا رَسُولَ اللَّـهِ! أَخْبِرْنِـي بِعَمَلٍ يُدْخِلُنِي الْجَنَّةَ وَيُبَاعِدْنِي مِنَ النَّارِ، قَالَ: لَقَدْ سَأَلْت عَنْ عَظِيمٍ، وَإِنَّهُ لَيَسِيرٌ عَلَى مَنْ يَسَّرَهُ اللَّهُ عَلَيْهِ: تَعْبُدُ اللَّـهَ وَلَا تُشْرِكْ بِهِ شَيْئًا، وَتُقِيمُ الصَّلَاةَ، وَتُؤْتِي الزَّكَاةَ، وَتَصُومُ رَمَضَانَ، وَتَحُجُّ الْبَيْتَ، ثُمَّ قَالَ: أَلَا أَدُلُّك عَلَى أَبْوَابِ الْخَيْرِ؟ الصَّوْمُ جُنَّةٌ، وَالصَّدَقَةُ تُطْفِئُ الْخَطِيئَةَ كَمَا يُطْفِئُ الْمَاءُ النَّارَ، وَصَلَاةُ الرَّجُلِ فِي جَوْفِ اللَّيْلِ، ثُمَّ تَلَا: تَتَجَافَى جُنُوبُهُمْ عَنِ الْمَضَاجِعِ حَتَّى بَلَغَ يَعْمَلُونَ، ثُمَّ قَالَ: أَلَا أُخْبِرُك بِرَأْسِ الْأَمْرِ وَعَمُودِهِ وَذُرْوَةِ سَنَامِهِ؟ قُلْت: بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: رَأْسُ الْأَمْرِ الْإِسْلَامُ، وَعَمُودُهُ الصَّلَاةُ، وَذُرْوَةُ سَنَامِهِ الْجِهَادُ، ثُمَّ قَالَ: أَلَا أُخْبِرُك بِمَلَاكِ ذَلِكَ كُلِّهِ؟ فَقُلْت: بَلَى يَا

رَسُولَ اللَّه! فَأَخَذَ بِلِسَانِهِ وَقَالَ: كُفَّ عَلَيْك هَـذَا. قُلْـت: يَـا نَبِيَّ اللَّهِ وَإِنَّا لَمُؤَاخَذُونَ بِمَا نَتَكَلَّمُ بِهِ؟ فَقَالَ: ثَكِلَتْـك أُمُّـك وَهَلْ يَكُبُّ النَّاسَ عَلَى وُجُوهِهِمْ -أَوْ قَالَ عَلَـى مَنَـاخِرِهِمْ- إلَّا حَصَائِدُ أَلْسِنَتِهِمْ؟!

رَوَاهُ التِّرْمِذِيُّ (رقم:٢٦١٦) وَقَالَ: حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

موعازی كوری جەبـەل دەڵێـت: گـوتم ئـەی پێغەمبـەری خواﷺ، شتێكم پێ بڵێ پێی بچمە بەهەشت و لـەئاگر دوور بكەومەوە.

پێغەمبــەرﷺ فــەرمووی: داوای شــتێكی گــەورەت كــرد، ئەوەش زۆر ئاسانە، كە خوا بۆی ئاسان بكات.

ئینجا فەرمووی: خـوای گـەورە بپەرسـتەو هاوبەشـی بـۆ پەیدامەكە، نوێژبكە، زەكات بـدە، ڕۆژووی ڕەمـەزان بگـرە، حەج بكە.

پاشــان فــەرمووی دەرگاكــانی چــاكەت پــێ بڵــێم؟ ڕۆژوو قەڵغانــە، چــاكەكردن گونــاح دەكوژێنێتــەوە، هــەروەك ئــاو

ئـاگر دەكوژێنێتــەوە، هـەروەها شـەونوێژیش، پاشـان ئـەم ئایەتەی خوێندەوە:

( تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ عَنِ ٱلْمَضَاجِعِ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿١٦﴾ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِىَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ )

واتــە: لــە خــوای خۆیــان دەپاڕێنــەوەو دەیپەرســتن و شەونوێژ ئەكەن، بە تەمای بەهەشتن و لەو ماڵەی پێمان داون ئەیبەخشن* كەس نازانێ ئەوەی لە بەهەشت بۆیان دانراوە لەوەی چاو پێی خۆش ئەبێ، ئەوەش پاداشتی ئەو كردەوە باشانەیە، كە لە دونیادا ئەیان كرد.

پاشان فەرموی: سەری هەمو خوا پەرستیەكت پێبڵێم؟

موعازدەڵێت: گوتم بەڵێ، ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ.

فــــەرموی: ســــەری هەموكردەوەیــــەك ئیســــلامە، كۆڵەكەكەشی نوێژكردنە، لوتكەی بەرزی ئیسلام جیهادە.

فەرموی: هەمو ئەوانەت پێبڵێم، کە ئەمانەی هەمو تێدابێت. گوتم بەڵێ.

پێغەمبەرﷺ بەدەست زمانی خۆی گرت، فەرموی: خۆت لەمە بپارێزە.

منیش گوتم: ئایە چۆن بەهۆی قسەکردنمانەوە سزا دەدرێین؟

فەرموی: دایکت رۆڵە رۆت بۆ بکات چۆن ئەمە نازانیت! زۆرترینی خەڵك بە هۆی زمانەوە دەچنە دۆزەخ.

## فەرمودەی سی

## خوا چەند شتێکی فەرزکردووە، ئێوە لە دەستیان مەدەن

عَنْ أَبِي ثَعْلَبَةَ الْخُشَنِيِّ جُرْثُومِ بن نَاشِبٍ ﷺ عَنْ رَسُولِ اللَّه ﷺ قَال: إنَّ اللَّهَ تَعَالَى فَرَضَ فَرَائِضَ فَلَا تُضَيِّعُوهَا، وَحَدَّ حُدُودًا فَلَا تَعْتَدُوهَا، وَحَرَّمَ أَشْيَاءَ فَلَا تَنْتَهِكُوهَا، وَسَكَتَ عَنْ أَشْيَاءَ رَحْمَةً لَكُمْ غَيْرَ نِسْيَانٍ فَلَا تَبْحَثُوا عَنْهَا.

حَدِيثٌ حَسَنٌ، رَوَاهُ الدَّارَقُطْنِيّ فِي سننه (١٨٤/٤)، وَغَيْرُهُ.

ئەبو سەعلەبەی خوشەنی دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: خوای گەورە چەند شتێکی لە سەر ئێوە فەرزکردوە، ئێوەش لە دەستیان مەدەن، چەند سنورێکی بۆ داناون مەیان بەزێنن، هەندێك شتی حەڕام کردوە پێشێلی مەکەن ونزیکی مەکەون، وەك بەزەیی نواندن بۆ ئێوە لە هەندێك شت بێ دەنگ بوە بەبێ بیرکردن، کەواتە ئێوەش لێی مەکۆڵنەوە.

## فەرمودەی سی ویەك

## دنیا بەكەم بگرە، خوا خۆشی دەوێت

عَنْ أَبِي الْعَبَّاسِ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ ﷺ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّه! دُلَّنِي عَلَى عَمَلٍ إِذَا عَمِلْتُهُ أَحَبَّنِي اللَّهُ، وَأَحَبَّنِي النَّاسُ، فَقَالَ: ازْهَدْ فِي الدُّنْيَا يُحِبُّك اللَّهُ، وَازْهَدْ فِيمَا عِنْدَ النَّاسِ يُحِبُّك النَّاسُ.

حديث حسن، رَوَاهُ ابْنُ مَاجَهْ (رقم:٤١٠٢)، وَغَيْرُهُ بِأَسَانِيدَ حَسَنَةٍ.

**سەهلی كوڕی سەعدی ساعدی دەڵێت؛**

**پیاوێك هاتە لای پێغەمبەرﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەرﷺ! ڕێگایەكم پێ نیشان بدە هەركاتێك كردم، خوا خۆشی بوێم و خەڵك خۆشیان بوێم.**

پێغەمبەرﷺ فەرموی: دنیا لـە دڵت بەکەم بگـرە، ئـەو کاتە خوا خۆشی دەوێیت، دڵت پەیوەند نەبێت بەوەی، کـە خەڵك هەیەتی و واز لەم شتە بێنە، کە لـە دەسـتی خـەڵك دایـەو خـۆتی پـێ خـەریك مەکە، ئـەو کاتـە خـەڵك تۆیـان خۆش دەوێت.

## فەرمودەی سی و دوو

## نە زیان لەخۆت بدە، نە زیان لە خەڵك

**عَنْ أَبِي سَعِيدٍ سَعْدِ بْنِ مَالِكِ بْنِ سِنَانٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَا ضَرَرَ وَلَا ضِرَارَ .**

حَدِيثٌ حَسَنٌ، رَوَاهُ ابْنُ مَاجَهْ (راجع رقم:٢٣٤١)، وَالدَّارَقُطْنِيّ (رقم:٤/٢٢٨)، وَغَيْرُهُمَا مُسْنَدًا. وَرَوَاهُ مَالِكٌ (٧٤٦/٢) فِي الْمُوَطَّإِ عَنْ عَمْرِو بْنِ يَحْيَى عَنْ أَبِيهِ عَنْ النَّبِيِّ ﷺ مُرْسَلًا، فَأَسْقَطَ أَبَا سَعِيدٍ، وَلَهُ طُرُقٌ يُقَوِّي بَعْضُهَا بَعْضًا.

**ئەبو سەعیدی خودری دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: هیچ زیان پێگەیاندنێك لە ئیسلام ڕەوانیە، كە لە خۆتی بدەیت، هەروەها هیچ زیان لێدانێكیش لە خەڵك ڕەوانیە بۆ ئەوەی سود بە خۆت بگات.**

## فەرمودەی سی وسێ

## داواكار دەبێ شایەتی هەبێ

**عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَوْ يُعْطَى النَّاسُ بِدَعْوَاهُمْ لَادَّعَى رِجَالٌ أَمْوَالَ قَوْمٍ وَدِمَاءَهُمْ، لَكِنَّ الْبَيِّنَةَ عَلَى الْمُدَّعِي، وَالْيَمِينَ عَلَى مَنْ أَنْكَرَ.**

حَدِيثٌ حَسَنٌ، رَوَاهُ الْبَيْهَقِيّ(في السنن ١٠/٢٥٢)، وَغَيْرُهُ هَكَذَا، وَبَعْضُهُ فِي الصَّحِيحَيْنِ.

**ئیبن عەباس دەڵێت: ئەگەر ئەوەی خەڵك داوای دەكەن، بەبێ هیچ بەڵگەیەك پێیان بدرێ، ئەوا هەندێكیان هەر لە خۆیانەوە داوای ماڵی خەڵكی تر دەكەن و تەماعی دەكەن، هەروەها داوای خوێنی كەسانی تریان دەكرد، لەبەر ئەوە داواكار لەسەریەتی شایەتی هەبێ، سوێندیش لەسەر ئەو كەسەیە، كە نكۆڵی دەكات لەوەی داوای لێكراوە.**

## فەرمودەی سی وچوار

**هەرکەسێك خراپەیەکی بینی،**
**با بە دەست بیگۆڕێت**

عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: سَمِعْت رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: مَنْ رَأَى مِنْكُمْ مُنْكَرًا فَلْيُغَيِّرْهُ بِيَدِهِ، فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِلِسَانِهِ، فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِقَلْبِهِ، وَذَلِكَ أَضْعَفُ الْإِيمَانِ.
رَوَاهُ مُسْلِمٌ (رقم:٤٩).

ئەبوسەعیدی خودری دەڵێت: پێغەمبەرﷺ فەرموی: هەرکەسێك شتێکی ناڕەواو خراپی بینی، با بەدەست بیگۆڕێت، ئەگەر بەدەست نەیتوانی بیگوڕێت، بە زمان داوای گۆڕینی بکات، ئەگەر بەزمان نەیتوانی بە دڵ پێی ناخۆش بێت، کە ئەمەش لاوازترینی ئیمانە.

## فەرمودەی سی وپێنج

## حەسودی بەیەك مەبەن و رقتان لە یەكتریی نەبێتەوە

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لَا تَحَاسَدُوا، وَلَا تَنَاجَشُوا، وَلَا تَبَاغَضُوا، وَلَا تَدَابَرُوا، وَلَا يَبِعْ بَعْضُكُمْ عَلَى بَيْعِ بَعْضٍ، وَكُونُوا عِبَادَ اللَّهِ إِخْوَانًا، الْمُسْلِمُ أَخُو الْمُسْلِمِ، لَا يَظْلِمُهُ، وَلَا يَخْذُلُهُ، وَلَا يَكْذِبُهُ، وَلا يَحْقِرُهُ، التَّقْوَى هَاهُنَا، وَيُشِيرُ إِلَى صَدْرِهِ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، بِحَسْبِ امْرِئٍ مِنَ الشَّرِّ أَنْ يَحْقِرَ أَخَاهُ الْمُسْلِمَ، كُلُّ الْمُسْلِمِ عَلَى الْمُسْلِمِ حَرَامٌ: دَمُهُ وَمَالُهُ وَعِرْضُهُ.

رَوَاهُ مُسْلِمٌ (رقم:٢٥٦٤).

ئەبو هورەیرە دەڵێت: پێغەمبەرﷺ فەرموی: ئێرەیی بە یەكتر مەبەن، بە فرت وفێڵ نرخ و شتومەكی فرۆشراو

زیاد مەكەن، كە ناشتانەوێ بیكڕن، ڕقتان لە یەكتر نەبێت، پشت لە یەكتری مەكەن و قسە لە یەكتری مەبڕن، دوكاندارەكان! نرخی شت لەسەر یەكتر گران و هەرزان مەكەن، ببنە برای دینی، موسڵمان برای موسڵمانە، ستەمی لێناكات، سەرشۆڕی ناكات، سوكی ناكات، بە درۆی ناخاتەوەو درۆی لەگەڵ ناكات، سێ جار دەستی لەسەر سینگ دانا، فەرموی: لەخواترسان لێرەیە، خوێن و ماڵ و ناموسی موسڵمان لەسەر یەكتر حەرامە.

## فەرمودەی سی وشەش

## هەركەسێ ناخۆشیەك لەسەر بڕوادارێك لاببات

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنْ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَنْ نَفَّسَ عَنْ مُؤْمِنٍ كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ الدُّنْيَا نَفَّسَ اللَّهُ عَنْهُ كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ يَوْمِ الْقِيَامَةِ، وَمَنْ يَسَّرَ عَلَى مُعْسِرٍ، يَسَّرَ اللَّهُ عَلَيْهِ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ، وَمَنْ سَتَرَ مُسْلِمًا سَتَرَهُ اللهُ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ ، وَاللَّهُ فِي عَوْنِ الْعَبْدِ مَا كَانَ الْعَبْدُ فِي عَوْنِ أَخِيهِ، وَمَنْ سَلَكَ طَرِيقًا يَلْتَمِسُ فِيهِ عِلْمًا سَهَّلَ اللَّهُ لَهُ بِهِ طَرِيقًا إِلَى الْجَنَّةِ، وَمَا اجْتَمَعَ قَوْمٌ فِي بَيْتٍ مِنْ بُيُوتِ اللَّهِ يَتْلُونَ كِتَابَ اللَّهِ، وَيَتَدَارَسُونَهُ فِيمَا بَيْنَهُمْ إِلَّا نَزَلَتْ عَلَيْهِمُ السَّكِينَةُ، وَغَشِيَتْهُمُ الرَّحْمَةُ، وَذَكَرَهُمُ اللَّهُ فِيمَنْ عِنْدَهُ، وَمَنْ أَبْطَأَ بِهِ عَمَلُهُ لَمْ يُسْرِعْ بِهِ نَسَبُهُ.

رَوَاهُ مُسْلِمٌ (رقم:٢٦٩٩) بهذا اللفظ.

هەرکەسێك ناخۆشیەك لە ناخۆشیەکانی دونیا لە سەر موسـڵمانێك لابـدات، خـوای گـەورە ناخۆشـیەك لـە ناخۆشـیەکانی قیامـەتی لەسـەر لادەدات، هەرکەسـێك کارئاسانی بۆ موسڵمانێکی قەرزار بکات، جا بە پێدانی ماڵ و سـامان بێـت، یـان بـە وەسـتان لەسـەر قەرزارەکـە، هـەتا دەیداتـەوە، بێـت، خـوای گـەورە بـاری لـە دونیـاو قیامـەت سـوك دەکـات، هەرکەسـێك عـەیبی موسـڵمانێك داپۆشـێت، خوای گەورە لە قیامەت عەیبی دادەپۆشێت، هـەر کەسـێك یارمەتی براکەی بدات خـوای گەورە یارمـەتی دەدات، هـەر کەسـێك ڕێگایـەك بگرێتـە بـەر بـۆ زانسـت خـوای گـەورە ڕێگاکـەی بـۆ ئاسـان دەکـات، هـەر کۆمـەڵێك لـە ماڵێـك لـە ماڵەکانی خـوا کۆببنـەوە بـۆ خوێنـدن و فێربـونی قورئـان، ئەوا خوای گەورە ئارامیـان بەسـەردا دەڕژێنێـت و بـەزەیی خوا دایان دەپۆشێت و فریشتە دەوریان دەدات، خـوا لـەلای ئەوانە باسیان دەکـات، کـە لـەلای ئـەون، کـە فریشتەکانن، هەر کەسێك کردەوەی کـەم بێـت، نـەژادو ڕەچـەڵکی پێشـی ناخات.

## فەرموودەی سی و حەفت

## خوا چاکە و خراپەی نوسیوە

عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا عَنْ رَسُولِ اللَّه ﷺ فِيمَا يَرْوِيهِ عَنْ رَبِّهِ تَبَارَكَ وَتَعَالَى، قَالَ: إِنَّ اللَّهَ كَتَبَ الْحَسَنَاتِ وَالسَّيِّئَاتِ، ثُمَّ بَيَّنَ ذَلِكَ، فَمَنْ هَمَّ بِحَسَنَةٍ فَلَمْ يَعْمَلْهَا كَتَبَهَا اللَّهُ عِنْدَهُ حَسَنَةً كَامِلَةً، وَإِنْ هَمَّ بِهَا فَعَمِلَهَا كَتَبَهَا اللَّهُ عِنْدَهُ عَشْرَ حَسَنَاتٍ إِلَى سَبْعِمِائَةِ ضِعْفٍ إِلَى أَضْعَافٍ كَثِيرَةٍ، وَإِنْ هَمَّ بِسَيِّئَةٍ فَلَمْ يَعْمَلْهَا كَتَبَهَا اللَّهُ عِنْدَهُ حَسَنَةً كَامِلَةً، وَإِنْ هَمَّ بِهَا فَعَمِلَهَا كَتَبَهَا اللَّهُ سَيِّئَةً وَاحِدَةً.

رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ (رقم:٦٤٩١)، وَمُسْلِمٌ (رقم:١٣١)، في صحيحيهما بهذه الحروف.

عبدالله کوڕی عەباس دەڵێت: پێغەمبەرﷺ فەرموی: خوای گەورە چاکەو خراپەی نوسیوە، پاشان ڕوونی

كردۆتەوە هەركەسێك ئارەزووى كردەوەى چاكى هەبێت و ئەنجامى نەدات خواى گەورە بەچاكەيەكى تەواو بۆى دەنوسێت، ئەگەر ئەنجاميشى نەدات، هەركەسێكيش ئارەزووى چاكەيەكى هەبێت و ئەنجامى بدات خواى گەورە بە دەچاكە تا حەفت سەد چاكە، بەڵكو چەندانى ترى بۆ دەنوسێت، ئەگەر كەسێك ئارەزووى خراپەيەك بكات، پاشان خراپەكە نەكات، خواى گەورە چاكەيەكى بۆ دەنوسێت، ئەگەر خراپەكەش ئەنجام بدات، خواى گەورە تەنها يەك خراپەى بۆ دەنوسێت.

## فەرمودەی سی و هەشت

## هەرکەسێ دژایەتی دۆستێکم بکات، جەنگی لەگەڵ دەکەم

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُول اللّٰهِ ﷺ إِنَّ اللّٰـهَ تَعَـالَى قَالَ: مَنْ عَادَى لِي وَلِيًّا فَقْد آذَنْتُهُ بِالْحَرْبِ، وَمَا تَقَرَّبَ إِلَيَّ عَبْدِي بِشَيْءٍ أَحَبَّ إِلَيَّ مِمَّا افْتَرَضْتُهُ عَلَيْه، وَلَا يَزَالُ عَبْدِي يَتَقَرَّبُ إِلَيَّ بِالنَّوَافِلِ حَتَّى أُحِبَّهُ، فَإِذَا أَحْبَبْتُهُ كُنْـت سَـمْعَهُ الَّذِي يَسْمَعُ بِهِ، وَبَصَرَهُ الَّذِي يُبْصِرُ بِهِ، وَيَـدَهُ الَّتِـي يَـبْطِشُ بِهَا، وَرِجْلَهُ الَّتِي يَمْشِي بِهَا، وَلَئِنْ سَأَلَنِي لَأُعْطِيَنَّـهُ، وَلَـئِنْ اسْتَعَاذَنِي لَأُعِيذَنَّهُ.

رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ(رقم:٦٥٠٢).

ئـەبو هـوڕەیرە دەڵێـت: پێغەمبـەر ﷺ فـەرموی: خـوای گەورە دەفەرموێت: هەرکەسێك دژایـەتی دۆسـتێکم بکـات،

جەنگى لە دژ ڕادەگەیەنم، بەندەكەم بەهەر شتێ لێم نزیك دەببێتەوە، لەوەم پێخۆشتر نیە، كە بەو شتانە لێم نزیك دەبێتەوە، كە لە سەریانم فەرزو پێویست كردوە، بەندەكەم بەردەوام بە سوننەتەكان لێم نزیك دەبێتەوە، تا خۆشم دەوێت، كاتێك خۆشم ویست دەبمە یارمەتیدەری، هەروا ئەم چاوانەی، كە پێی دەبینێت، ئەم گوێچكانەی، كە پێی دەبیستێت، ئەم قاچانەی، كە بۆ كاری خێر پێی دەڕوات، كاتێك داوام لێدەكات پێی دەبەخشم، كاتێك پەنام پێدەگرێت پەنای دەدەم.

## فەرمودەی سی و نۆ

## خوا چاوپۆشی لە هەڵەو لە بیرچونی ئوممەتەکەم کردوە

عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: **إِنَّ اللَّهَ تجَاوَزَ لِي عَنْ أُمَّتِي الْخَطَأَ وَالنِّسْيَانَ وَمَا اسْتُكْرِهُوا عَلَيْهِ.**

حَدِيثٌ حَسَنٌ، رَوَاهُ ابْنُ مَاجَهْ (رقم:٢٠٤٥)، وَالْبَيْهَقِيّ (السنن٧)، صححه الألباني في صحيح سنن إبن ماجة

**ئیبن عەباس دەڵێت: پێغەمبەرﷺ فەرموی: خوای گەورە چاوپۆشی کردوە لە هەڵەی ئوممەتەکەم و لە بیرچون و ئەوشتانەی بەزۆر پێیان دەکرێت.**

## فەرمودەی چلەم

## لە دونیا وەك نامۆ و ڕێبوارێك بژی

عَنْ ابْن عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: أَخَذَ رَسُولُ اللَّهِﷺ بِمَنْكِبِي، وَقَالَ: كُنْ فِي الدُّنْيَا كَأَنَّك غَرِيبٌ أَوْ عَابِرُ سَبِيل. وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا يَقُولُ: إذَا أَمْسَيْتَ فَلَا تَنْتَظِرْ الصَّبَاحَ، وَإِذَا أَصْبَحْتَ فَلَا تَنْتَظِرْ الْمَسَاءَ، وَخُذْ مِنْ صِحَّتِك لِمَرَضِك، وَمِنْ حَيَاتِك لِمَوْتِك.

رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ (رقم:٦٤١٦).

ئیبن عمر دەڵێت: پێغەمبەرﷺ شانمی گرت فەرموی: وەك نامۆو ڕێبوارێك لە دونیا بژی، ئیبن عومەر دەڵێ: كاتێ ئێوارەت بەسەرداهات چاوەڕوانی بەیانی مەبە، هەروەها، كە بەیانیت بەسەر داهات چاوەڕوانی ئێوارە مەكە، پێش ئەوەی نەخۆش بكەویت لەش ساغیت بقۆزەوەو كاری چاكە زۆر بكە، بەر لە مردنیش سود لە ژیانت وەربگرە.

## فەرمودەی چل ویەك

**هیچ كەسێك باوەڕی تەواو نابێت، هەتا هەواو ئارەزووەكانی شوێنكەوتەی پەیامەكەم نەبێت**

عَنْ أَبِي مُحَمَّدٍ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: **قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لَا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى يَكُونَ هَوَاهُ تَبَعًا لِمَا جِئْتُ بِهِ.**

حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، رَوَيْنَاهُ فِي كِتَابِ الْحُجَّةِ بِإِسْنَادٍ صَحِيحٍ.

**عبدالله كوڕی عەمری كوڕی عاص دەڵێت: هیچ كەسێك باوەڕی تەواو نابێت، هەتا هەواو ئارەزووەكانی شوێنكەوتەی پەیامەكەم نەبێت، كە لە لایەن خواوە بۆم هاتوە.**

## فەرمودەی چل و دوو

**ئەی بەنی ئادەم هەرکاتێك داوام لێ بکەیت لە گوناحت خۆش بم لە گوناحت خۆش دەبم**

**عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: سَمِعْت رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: قَالَ اللَّهُ تَعَالَى: يَا ابْنَ آدَمَ! إنَّك مَا دَعَوْتنِي وَرَجَوْتنِي غَفَرْتُ لَك عَلَى مَا كَانَ مِنْك وَلَا أُبَالِي، يَا ابْنَ آدَمَ! لَوْ بَلَغَتْ ذُنُوبُك عَنَانَ السَّمَاءِ ثُمَّ اسْتَغْفَرْتنِي غَفَرْتُ لَك، يَا ابْنَ آدَمَ! إنَّك لَوْ أَتَيْتنِي بِقُرَابِ الْأَرْضِ خَطَايَا ثُمَّ لَقِيتنِي لَا تُشْرِكُ بِي شَيْئًا لَأَتَيْتُك بِقُرَابِهَا مَغْفِرَةً.**

رَوَاهُ التِّرْمِذِيُّ (رقم: ٣٥٤٠)، وَقَالَ: حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.

**ئەنەس دەڵێت: پێغەمبەرﷺ فەرموی: خوای گەورە دەفەرموێت: ئەی بەنی ئادەم هەرکاتێك داوام لێ بکەیت**

لە گوناحت خۆش بم لە گوناحت خۆش دەبم و گوێشی پێ نادەم، ئەی بەنی ئادەم ئەگەر گوناحەکانت بگاتە ئەو پەری ئاسمانەوە پاشان داوای لێ خۆشبونم لێ بکەیت لێت خۆش دەبم، ئەی بەنی ئادەم ئەگەر یەك بەزەوی گوناح لەگەڵ خۆت بینی بەس هاوبەشم بۆ پەیدا نەکەیت یەك بەدونیا لێخۆشبونت پێ دەبەخشم.

## ناوەرۆك

پێشەكی................................ ٥
فەرموودەی یەكەم................................٧
كردەوەكان بە پێی نیەتە ................................٧
فەرموودەی دووەم ................................٩
هاتنی جوبرائیل بۆ ئەوەی موسڵمانان فێری دینەكەیان بكات........٩
فەرموودەی سێیەم................................ ١٣
ئیسلام لە سەر پێنج بنەما دامەزراوە ................................ ١٣
فەرموودەی چوارەم ................................ ١٤
هەر یەكێك لەئێوە لە سكی دایكیدا چل ڕۆژ نوتفەیە ................ ١٤
فەرمووودەی پێنجەم................................ ١٧
هەركەسێك لە دین شتێكی زیاد داهێنێت، لێی وەرناگرێت........ ١٧
فەرموودەی شەشەم................................ ١٨
حەڵاڵ و حەرام ڕونكراوەتەوە................................ ١٨
فەرموودەی حەفتەم................................ ٢٠
دین ئامۆژگاری و دڵسۆزییە................................ ٢٠
فەرموودەی هەشتەم ................................ ٢١
فەرمانم پێكراوە لە گەڵ خەڵكیدا بجەنگم، هەتا شایەتومان دەهێنن٢١

فەرمودەی نۆیەم ........................ ٢٣
ئەو شتانەی لە ئێوەم قەدەغە کردووە، مەیکەن ............... ٢٣
فەرمودەی دەیەم ........................ ٢٥
خوا پاکەو پاکیش وەردەگرێت ........................ ٢٥
فەرمودەی یازدەم........................ ٢٧
واز لەم شتە بهێنە کە گومانت لێی هەیە........................ ٢٧
فەرمودەی دوازدەهەم........................ ٢٨
خۆهەڵنەقورتاندن لە شتی خەڵك........................ ٢٨
فەرمودەی سێزدە........................ ٢٩
چیت بۆ خۆت پێخۆشە، بۆ براکەشت بەهەمان شێوە............ ٢٩
فەرمودەی چواردەهەم........................ ٣٠
خوێنی موسڵمان بە یەکێ لە سێ شت حەڵاڵ دەبێت............ ٣٠
فەرمودەی پازدەهەم ........................ ٣١
هەرکەسێ بڕوای بەخواو ڕۆژی دوایی هەیە باقسەی چاك بکات، یا
بێدەنگ بێت ........................ ٣١
فەرمودەی شازدەم........................ ٣٢
تووڕەمەبە ........................ ٣٢
فەرمودەی حەڤدەم........................ ٣٣
خوا چاکەی لە سەر هەموشتێك نوسیوە ........................ ٣٣
فەرمودەی هەژدەهەم ........................ ٣٤
لە هەر کوێیبیە بویت لە خوا بترسە ........................ ٣٤

فەرمودەی نۆزدەهەم ........................ ٣٥
ڕۆڵە چەند وشەیەکت فێردەکەم........................ ٣٥
فەرمودەی بیستەم........................ ٣٨
گەر شەرمت نەکرد چی دەکەی بیکە ........................ ٣٨
فەرمودەی بیست ویەك ........................ ٣٩
بڵێ: باوەڕی تەواوم بەخواهەیە، ئینجا لەسەرئەم باوەڕە بەردەوام بە ٣٩
فەرمودەی بیست و دوو ........................ ٤٠
ئەگەر نوێژەکانم بکەم و ڕۆژی ڕەمەزانم گرت ........................ ٤٠
فەرمودەی بیست وسێ........................ ٤١
پاك وخاوێنی نیوەی ئیمانە........................ ٤١
فەمودەی بیست و چوار ........................ ٤٣
بەندەکانم: من ستەمم لە سەر خۆم حەرام کردووە........................ ٤٣
فەرمودەی بیست وپێنج........................ ٤٧
دەوڵەمەندان پاشتی گەورەیان بەدەست هێناوە ........................ ٤٧
فەرمودەی بیست وشەش........................ ٥٠
هەر جومگەیەکی خەڵك خێرێکی لە سەرە........................ ٥٠
فەرمودەی بیست و حەفت........................ ٥٢
چاکە ڕەوشت جوانیە........................ ٥٢
فەرمودەی بیست وهەشت ........................ ٥٤
ئامۆژگاریتان دەکەم لەخوا بترسن ........................ ٥٤
فەرمودەی بیست ونۆ ........................ ٥٦

خوا بپەرستەو هاوەڵی بۆ پەیدا مەکە .................. ٥٦
فەرمودەی سی .............................. ٦٠
خوا چەند شتێکی فەرزکردووە، ئێوە لە دەستیان مەدەن ......... ٦٠
فەرمودەی سی ویەك .......................... ٦١
دنیا بەکەم بگرە، خوا خۆشی دەوێیت .................... ٦١
فەرمودەی سی و دوو .......................... ٦٣
نە زیان لەخۆت بدە، نە زیان لە خەڵك.................... ٦٣
فەرمودەی سی وسێ............................ ٦٤
داواکار دەبێ شایەتی هەبێ ......................... ٦٤
فەرمودەی سی وچوار .......................... ٦٥
هەر کەسێك خراپەیەکی بینی، با بە دەست بیگۆڕێت........... ٦٥
فەرمودەی سی وپێنج........................... ٦٦
حەسودی بەیەك مەبەن و رقتان لە یەکتریی نەبێتەوە.......... ٦٦
فەرمودەی سی وشەش .......................... ٦٨
هەرکەسێ ناخۆشیەك لەسەر براوادارێك لاببات ............... ٦٨
فەرموودەی سی و حەفت........................ ٧٠
خوا چاکە و خراپەی نوسیوە ........................ ٧٠
فەرمودەی سی و هەشت ........................ ٧٢
هەرکەسێ دژایەتی دۆستێکم بکات، جەنگی لەگەڵ دەکەم ....... ٧٢
فەرمودەی سی و نۆ .......................... ٧٤
خوا چاوپۆشی لە هەڵەو لە بیرچونی نومەتەکەم کردوە........... ٧٤

فەرمودەی چلەم ........................................ ٧٥
لە دونیا وەك نامۆ و ڕێبوارێك بژی ........................ ٧٥
فەرمودەی چل ویەك .................................... ٧٦
هیچ كەسێك باوەڕی تەواو نابێت، هەتا هەواو ئارەزووەكانی
شوێنكەوتەی پەیامەكەم نەبێت .............................. ٧٦
فەرمودەی چل و دوو .................................... ٧٧
ئەی بەنی ئادەم هەركاتێك داوام لیَ بكەیت لە گوناحت خۆش بم لە
گوناحت خۆش دەبم ...................................... ٧٧
ناوەرۆك ................................................ ٧٩